# ذِكْرُ الْمَقَامِ الْمَحْمُودِ

باسێك له مه‌قامی مه‌حمود،
فه‌زل پێگه‌ی پێغه‌مبه‌رمان
(ﷺ) له دوارۆژدا

﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾

كۆكردنه‌وه
و ئاماده كردنی
أبو عبدالرحمن الحنبلي

١ - أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ أَصْرَمَ الْمُزَنِيُّ، قَالَ: ثَنَا عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْعَظِيمِ، قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ الْعَنْبَرِيُّ، قَالَ: ثَنَا مُسْلِمُ بْنُ جَعْفَرٍ وَكَانَ ثِقَةً، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ سَيْفٍ السَّدُوسِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ، قَالَ: «إِنَّ مُحَمَّدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ بَيْنَ يَدَيِ الرَّبِّ ، عَلَى كُرْسِيِّ الرَّبِّ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

عبد اللّٰه بن سلام ووتى : محمد رسول اللّٰه (ﷺ) له ڕۆژى قيامەتدا لەبەردەم پەروەردگارە، لەسەر كورسى پەروەردگار

(كورسى) شوێن پێى اللّٰه يه

٢ - أَخْبَرَنَا أَبُو دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيُّ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي صَفْوَانَ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ، قَالَ: ثَنَا سَلْمُ بْنُ جَعْفَرٍ مِنْ أَهْلِ صَنْعَاءَ قَالَ: ثَنَا سَعِيدُ الْجُرَيْرِيُّ، قَالَ: ثَنَا سَيْفُ السَّدُوسِيُّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ، قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ جِيءَ بِنَبِيِّكُمْ ﷺ فَأُقْعِدَ بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ عَلَى كُرْسِيِّهِ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

عبد اللّٰه بن سلام ووتى : كاتێك ڕۆژى قيامەت هات، ئەوا پێغەمبەرەكەتان دەهێندرێت لەبەردەم اللّٰه دادەنيشێندرێت لەسەر كورسيەكەى

٣ - وَأَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ صَدَقَةَ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي صَفْوَانَ الثَّقَفِيُّ (٢١٢)، قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ الْعَنْبَرِيُّ، قَالَ: ثَنَا سَلْمُ بْنُ جَعْفَرٍ الْبَكْرَاوِيُّ مِنْ وَلَدِ أَبِي بَكْرَةَ، قَالَ: ثَنَا سَعِيدٌ الْجُرَيْرِيُّ، قَالَ: ثَنَا سَيْفٌ السَّدُوسِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ جِيءَ بِنَبِيِّكُمْ ﷺ حَتَّى يُجْلِسَهُ بَيْنَ يَدَيْهِ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

عبد اللّٰه بن سلام ووتی : کاتێک ڕۆژی قیامەت هات، ئەوا پێغەمبەرەکەتان دەهێندرێت تا دادەنیشێندرێت لەبەردەمیدا(بەردەمی اللّٰه)

٤ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ الدَّقِيقِيُّ، قَالَ: ثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْحَسَنِ بْنِ سُلَيْمَانَ، قَالَ: ثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]، قَالَ: «يُجْلِسُهُ عَلَى الْعَرْشِ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

موجاهید سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]، ووتی دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش (واتا محمد ﷺ )

٥ - أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ الدَّقِيقِيُّ، قَالَ: ثَنَا عُثْمَانُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي شَيْبَةَ، قَالَ: ثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ (٢١٤): ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُجْلِسُهُ مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ»

## السنة لأبي بكر بن الخلال

موجاهيد سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]، ووتى دايدەنيشێنێت لاى خۆى لەسەر عەڕش

٦ - أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ وَاصِلٍ الْمُقْرِئُ، قَالَ: ثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، قَالَ: ثَنَا ابْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ» . فَسَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ أَحْمَدَ بْنِ وَاصِلٍ، قَالَ: مَنْ رَدَّ حَدِيثَ مُجَاهِدٍ فَهُوَ جَهْمِيٌّ

## السنة لأبي بكر بن الخلال

موجاهيد سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]، ووتى دايدەنيشێنێت لەسەر عەڕش، وە گوێم لە محمد بن أحمد بن واصل بوو ووتى : هەر كەسێک فەرمووودەكەی موجاهيد ڕەت بكاتەوە ئەوا ئەو كەسە جەهميە، واتا هەر كەسێک ئەوە ڕەت بكاتەوە كە موجاهيد ووتى و نكۆڵى ئەوە بكات كە اللّٰه پێغەمبەر ﷺ دادەنێت لەسەر عەڕش ئەوە جەهميە

٧ - وَأَخْبَرَنَا أَبُو دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيُّ، قَالَ: ثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُوسَى الرَّازِيُّ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُجْلِسُهُ عَلَى عَرْشِهِ»، وَسَمِعْتُ أَبَا دَاوُدَ يَقُولُ: مَنْ أَنْكَرَ هَذَا فَهُوَ عِنْدَنَا مُتَّهَمٌ، وَقَالَ: مَا زَالَ النَّاسُ يُحَدِّثُونَ بِهَذَا، يُرِيدُونَ مُغَايَظَةَ الْجَهْمِيَّةِ، وَذَلِكَ أَنَّ الْجَهْمِيَّةَ (٢١٥) يُنْكِرُونَ أَنَّ عَلَى الْعَرْشِ شَيْئًا

السنة لأبي بكر بن الخلال

له موجاهیدەوە سەبارەت بە قەولی اللّٰه تعالی ﴿عَسَى أَن يَبعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]
ووتی اللّٰه تعالی، محمد رسول اللّٰه (صلی اللّٰه علیه وسلم) دادەنیشێنێت لەسەر عەرشی خۆی،
وە گوێم لە ابو داود السجستاني بوو دەیووت : هەرکەسێک نکۆڵی ئەمە بکات ئەوا ئەو کەسە لای ئێمە تۆمەتبار دەکرێت(بە جەهمی بوون)
وە ابو داود ووتیشی : بە بەردەوام خەڵکی ئەمە دەگێڕنەوە، دەیانەوێت جەهمیەکانی پێ تووڕە بکەن، لەبەر ئەوەی جەهمیەکان نکۆڵی ئەوە دەکەن کە شتێک هەبێت لەسەر عەڕش،

٨ - أَخْبَرَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: ثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُقْعِدُهُ مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ»، قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: مَنْ رَدَّهُ فَقَدْ رَدَّ عَلَى اللَّهِ ، وَمَنْ كَذَّبَ بِفَضِيلَةِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَدْ كَفَرَ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ.

السنة لأبي بكر بن الخلال

له موجاهیدەوه سەبارەت بە قەولی اللّٰه تعالی ﴿عَسَى أَن يَبعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]
ووتی اللّٰه تعالى، محمد رسول اللّٰه (صلى اللّٰه عليه وسلم) دادەنیشێنێت لەلای خۆی لەسەر عەڕش،
أبو بكر بن أبي طالب ووتی : هەرکەسێک ڕەتی بکاتەوە ئەوا اللّٰەی ڕەت کردۆتەوە، وە هەر کەسێک پێگەو فەزیلەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرۆ بزانێت، ئەوا کافرە بە اللّٰه مەزن

٩ - وَأَخْبَرَنِي أَحْمَدُ بْنُ أَصْرَمَ الْمُزَنِيُّ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَقَالَ: «مَنْ رَدَّ هَذَا فَهُوَ مُتَّهَمٌ عَلَى اللَّهِ وَرَسُوله، وَهُوَ عِنْدَنَا كَافِرٌ، وَزَعَمَ أَنَّ مَنَ قَالَ (٢١٦) بِهَذَا فَهُوَ ثَنَوِيٌّ، فَقَدْ زَعَمَ أَنَّ الْعُلَمَاءَ وَالتَّابِعِينَ ثَنَوِيَّةٌ، وَمَنْ قَالَ بِهَذَا فَهُوَ زِنْدِيقٌ يُقْتَلُ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

وە پێی ڕاگەیاندم أحمد بن أصرم المزني بەم فەرموودەیە، وە ووتی : هەر کەسێک ئەمە ڕەت بکاتەوە ئەوا تۆمەتبارە لەسەر اللّٰه و ڕەسولەکەی ﷺ، وە ئەو کەسە لای ئێمە کافرە، وە هەر کەسێک بانگەشەی ئەوە بکات کە هەر کەسێک ئەم فەرموودەیە بڵێت ئەوا ثنویة ئەوا بە دڵنیایی بانگەشەی ئەوەی کردووە کە زاناکان و تابعین ثنویەن، وە هەر کەسێک بەم شێوەیەی ووت ئەوا زەندیقە و دەکوژرێت

(ثنوية قەومێکی مەجوسین)

١٠ - وَأَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدُوسٍ، وَالْحَسَنُ بْنُ صَالِحٍ، وَبَعْضُهُمَا أَتَمُّ مِنْ بَعْضٍ، قَالَا: ثَنَا أَبُو بَكْرٍ الْمَرُّوذِيُّ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ حَمَّادٍ الْمُقْرِئُ: مَنْ ذُكِرَتْ عِنْدَهُ هَذِهِ الْأَحَادِيثُ فَسَكَتَ فَهُوَ مُتَّهَمٌ عَلَى الْإِسْلَامِ، فَكَيْفَ مَنْ طَعَنَ فِيهَا؟،

السنة لأبي بكر بن الخلال

أبو بكر بن حماد المقرئ ووتی : هەر کەسێک ئەم فەرموودەیەی لا باسکرا لێی بێدەنگ بوو ئەوا ئەو کەسە تۆمەتبار دەکرێت لەسەر ئیسلام، ئەبێ چۆن بێت بۆ ئەوکەسەی تانەی لێ دەدات.؟

١١ - وَقَالَ أَبُو جَعْفَرِ الدَّقِيقِيُّ: مَنْ رَدَّهَا فَهُوَ عِنْدَنَا جَهْمِيٌّ، وَقَالَ عَبَّاسُ الدُّورِيُّ: لَا يَرُدُّ هَذَا إِلَّا مُتَّهَمٌ، وَقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْهِ: الْإِيمَانُ بِهَذَا الْحَدِيثِ وَالتَّسْلِيمُ لَهُ،

السنة لأبي بكر بن الخلال

أبو الجعفر الدقيقي ووتی هەرکەسێک ئەمە ڕەتبکاتەوە ئەوا لای ئێمە جەهمییە،
وە عباس الدوري ووتی : ئەمە ڕەت ناکاتەوە ئیلا کەسێکی تۆمەتبار نەبێت،

١٢ - وَقَالَ إِسْحَاقُ بْنُ رَاهَوَيْهِ: الْإِيمَانُ بِهَذَا الْحَدِيثِ وَالتَّسْلِيمُ لَهُ، وَقَالَ إِسْحَاقُ لِأَبِي عَلِيٍّ الْقُوهُسْتَانِيِّ: مَنْ رَدَّ هَذَا الْحَدِيثَ فَهُوَ جَهْمِيٌّ، وَقَالَ عَبْدُ الْوَهَّابِ الْوَرَّاقُ لِلَّذِي رَدَّ فَضِيلَةَ النَّبِيِّ ﷺ يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ فَهُوَ مُتَّهَمٌ عَلَى الْإِسْلَامِ،

السنة لأبي بكر بن الخلال

إسحاق بن راهوية ووتی : واجبە ئیمان هێنان و تەسلیم بوون بەم فەرموودەیە،
وە إسحاق ووتی بە أبي علي القوهستاني هەر کەسێک ئەم فەرموودەیە ڕەت بکاتەوە ئەوا ئەو کەسە جەهمییە، وە عبدالوهاب الوراق ووتی بەو کەسەی کە پێگەو فەزیلەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتنی لەسەر عترش ڕەتبکاتەوە ئەوە تۆمەتبارە لەسەر ئیسلام

١٣ - وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ الْأَصْبَهَانِيُّ: هَذَا الْحَدِيثُ حَدَّثَ بِهِ الْعُلَمَاءُ مُنْذُ سِتِّينَ وَمِائَةِ سَنَةٍ، وَلَا يَرُدُّهُ إِلَّا أَهْلُ الْبِدَعِ، قَالَ: وَسَأَلْتُ حَمْدَانَ بْنَ عَلِيٍّ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَقَالَ: كَتَبْتُهُ مُنْذُ خَمْسِينَ سَنَةً، وَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا يَرُدُّهُ إِلَّا أَهْلُ الْبِدَعِ،

السنة لأبي بكر بن الخلال

إبراهيم الأصبهاني ووتى : ئەم فەرموودەیە زانایان گێڕاویانەتەوە، بەر لە ١٦٠ سال، وە هیچ کەسێک ڕەتی نەکردۆتەوە ئیلا ئەهلی بیدەع نەبووبن،
ووتی پرسیارم لە حمدان بن علي کرد سەبارەت بەم فەرموودەیە، جا ووتی نووسیومەتەوە بەر لە ٥٠ سال، وە هیچ کەسێکم نەدیوت ڕەتی بکاتەوە جگە لە ئەهلی بیدەع،

١٤ - وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ الْحَرْبِيُّ: حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ، وَمَا يُنْكِرُ هَذَا إِلَّا أَهْلُ الْبِدَعِ، وَسَمِعْتُ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ الْخَفَّافَ يَقُولُ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مُصْعَبٍ يَعْنِي الْعَابِدَ يَقُولُ: نَعَمْ، يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ لِيَرَى الْخَلَائِقُ مَنْزِلَتَهُ

السنة لأبي بكر بن الخلال

إبراهيم الحربي ووتی هاڕون بۆی باسکردین، کە هیچ کەسێک نکۆڵی لەمە ناکات جگە لە ئەهلی بیدەع، وە گوێم لە أبا عبداللّٰه الخفاف بوو دەیووت : بەڵێ دایدەنیشێنێت لەسەر عەرشی خۆی تا درووستکراوەکان پێگەو مەنزیلەتی ببینن

١٥ - وَأَخْبَرَنَا أَبُو يَحْيَى النَّاقِدُ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جَعْفَرٍ مُحَمَّدَ بْنَ مُصْعَبٍ الْعَابِدَ وَذَكَرَ حَدِيثَ ابْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: يُجْلِسُهُ عَلَى الْعَرْشِ، قَالَ ابْنُ مُصْعَبٍ: «يُجْلِسُهُ عَلَى الْعَرْشِ لِيَرَى الْخَلَائِقُ كَرَامَتَهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَنْزِلُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى أَزْوَاجِهِ وَجَنَّاتِهِ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

له موجاهیدەوە سەبارەت بەم قەوله ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]

ووتی دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش، ابن مصعب ووتی : دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش تا درووستکراوەکان مەنزلیەتو پێگەی ببینن وە ڕێز و شکۆی لەسەری، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دادەبەزێنرێت بۆ لای هاوسەرانی و باخەکانی

١٦ - وَسَمِعْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ صَدَقَةَ، يَقُولُ: حَدَّثَنَا أَبُو الْقَاسِمِ بْنُ الْجَبَلِيِّ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ هَارُونَ بْنَ مَعْرُوفٍ، يَقُولُ: «لَيْسَ يُنْكِرُ حَدِيثَ ابْنِ فُضَيْلٍ عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ إِلَّا الْجَهْمِيَّةُ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

هارون بن معروف دەیووت : نکۆڵی فەرموودەکەی ابن فضیل له لیث ـەوە له موجاهیدەوە ناکات ئیلا جەهمی نەبێت

١٧ - وَسَمِعْتُ أَبَا بَكْرِ بْنَ صَدَقَةَ، يَقُولُ: قَالَ إِبْرَاهِيمُ الْحَرْبِيُّ يَوْمًا، وَذَكَرَ حَدِيثَ لَيْثٍ عَنْ مُجَاهِدٍ، فَجَعَلَ يَقُولُ: هَذَا حَدَّثَ بِهِ عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ فِي الْمَجْلِسِ عَلَى رُءُوسِ النَّاسِ فَكَمْ تَرَى كَانَ فِي الْمَجْلِسِ، عِشْرِينَ أَلْفًا، فَتَرَى لَوْ أَنَّ إِنْسَانًا قَامَ إِلَى عُثْمَانَ، فَقَالَ (٢٢٠): لَا تُحَدِّثْ بِهَذَا الْحَدِيثِ، أَوْ أَظْهَرَ إِنْكَارَهُ، تَرَاهُ كَانَ يَخْرُجُ مِنْ ثَمَّ إِلَّا وَقَدْ قُتِلَ، قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ صَدَقَةَ، وَصَدَقَ، مَا حُكْمُهُ عِنْدِي إِلَّا الْقَتْلُ

**السنة لأبي بكر بن الخلال**

بيستم أبوبكر بن صدقة دەيووت : إبراهيم الحربي ڕۆژێك باسی فەرموودەی " ليث عن مجاهد ــی " كرد ووتی : ئەم فەرموودەیە عثمان بن أبي شيبة گێڕایەوە لە مەجلیس لەناو خەڵكیدا، پێت وایە چەند كەس لە مەجلیسەكەدا بوون؟
بیست هەزار، تۆ وای دەبینی گەر كەسێك هەستابوایە بە عثمان ــی ووتبا ئەم فەرموودەیە مەگێڕەوە یان ئینكاری لێكردبوایە پێت وایە لەم شوێنەدا دەرەچوو بەبێ كوشتن؟
الخلال دەڵێ : أبو بكر بن صدقة ووتی : إبراهيم ڕاستی كرد، حوكمی ئەو كەسە هیچ نیە لەلای من جگە لە كوشتن

١٨ - أَخْبَرَنِي الْحَسَنُ بْنُ صَالِحِ الْعَطَّارُ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ السَّرَّاجِ، قَالَ: "رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَمِينِهِ، وَعُمَرُ عَنْ يَسَارِهِ، رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْهِمَا وَرِضْوَانُهُ، فَتَقَدَّمْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِ عُمَرَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَقُولَ شَيْئًا فَأَقْبَلَ عَلَيَّ، فَقَالَ: قُلْ، فَقُلْتُ: إِنَّ التِّرْمِذِيَّ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ لَا يُقْعِدُكَ مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ، فَكَيْفَ تَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَقْبَلَ عَلَيَّ شِبْهَ الْمُغْضَبِ وَهُوَ يُشِيرُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى عَاقِدًا بِهَا أَرْبَعِينَ، وَهُوَ يَقُولُ: «بَلَى وَاللَّهِ، بَلَى وَاللَّهِ، بَلَى وَاللَّهِ، يُقْعِدُنِي مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ، بَلَى وَاللَّهِ يُقْعِدُنِي مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ، بَلَى وَاللَّهِ يُقْعِدُنِي مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ، ثُمَّ انْتَبَهْتُ»

## السنة لأبي بكر بن الخلال

محمد بن علي السراج ووتی : پێغەمبەری خوام بینیﷺ لە خەودا وە أبو بکر لە لای ڕاستیەوە بوو وە عومەریش لەلای چەپیەوە ڕەحمەت و ڕەزای اللّٰه یان لێبێت، جا چووم بەرەو پێغەمبەری خواﷺ و لێی نزیک بوومەوە جا وەستام لە لای چەپی عومەرەوە جا پێم ووت : ئەی پێغەمبەری خواﷺ من دەمەوێت شتێکت پێ بلێم لێمی قبول ئەکەیت.؟ فەرمووی : بڵێ

جا منیش پێم ووت کە الترمذي دەڵێت : اللّٰە تۆ دانانیشێنێت لەلای خۆی لەسەر عەڕش، جا تۆ چی دەڵێیت ئەی پێغەمبەری خوا.؟ جا ڕووی کردە لای من توڕەییەوە وە ئیشارەتی بۆ کردم بە دەستەکانی کە دانیشم بە شێوازێک کە پێیەکانم بکەمە چوار (دانیشتنی پیاوانە) جا ئەو دەیووت : بەڵێ واللّٰە سێجار وای ووت جا ووتی دامدەنیشێنێت لە لای خۆی لە سەر عەڕش دوو جار وای وت جا بە ئاگا هاتمەوە

١٩ - أَخْبَرَنَا أَبُو دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ «قِيلَ لَهُ (٢٢٢): لَيْثُ بْنُ أَبِي سُلَيْمٍ يُتَّهَمُ بِالْبِدْعَةِ؟ قَالَ: لَا»

السنة لأبي بكر بن الخلال

أبو داود السجستاني ووتى گوێم له احمد بن حنبل بوو، پێی ووترا ليث تۆمەتبار كراوە بە بيدعە.؟ ووتى نا

٢٠ - وَحَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ مُحْرِزُ بْنُ عَوْنٍ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ فِي قَوْلِهِ ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُجْلِسُهُ عَلَى الْعَرْشِ»، وَقَدْ سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ مَشْيَخَتِنَا، مَا رَأَيْتُ أَحَدًا رَدَّ هَذَا

السنة لأبي بكر بن الخلال

محرز بن عون ئەم فەرموودەيەى بۆ باسكردين ووتى بۆى باسكردين محمد بن فضيل له ليث ـەوە لە موجاهيدەوە سەبارەت بەم قەولە
﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]
ووتى دايدەنيشێنێت لەسەر عەڕش، وە ئەم فەرموودەيەم گوێ لێبووە لە زياتر لە يەكێک لە شێخ و مەشاييخەكانمان، وە نەمديوە هيچ يەكێک لەوان ئەمە ڕەتبكەنەوە،

٢١ - حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ، عَنِ ابْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ «وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مَنْزِلَتُهُ عِنْدَ اللَّهِ ﷻ أَكْثَرَ مِنْ هَذَا، وَمَنْ رَدَّ عَلَى مُجَاهِدٍ مَا قَالَهُ مِنْ قُعُودِ مُحَمَّدٍ ﷺ عَلَى الْعَرْشِ وَغَيْرَهُ، فَقَدْ كَذَبَ، وَلَا أَعْلَمُ أَنِّي رَأَيْتُ هَذَا التِّرْمِذِيَّ الَّذِي يُنْكِرُ حَدِيثَ مُجَاهِدٍ قَطُّ فِي حَدِيثٍ وَلَا غَيْرِ حَدِيثٍ

السنة لأبي بكر بن الخلال

بۆی باسکردین هارون بن معروف له ابن فضيل ـەوە له ليث ـەوە له موجاهیدەوە سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش، هارون ووتی وە من ئوومێدەوارم کە پێگەو مەنزلیەتی لای اللّٰه لەمە بەرزتر بێت و زۆرتر بێت، وە هەر کەسێک ڕەدی موجاهید بداتەوە لەسەر ئەوەی وتوویەتی لەسەر دانیشتنی محمدﷺ لەسەر عەڕش و غەیری ئەویش، ئەوا درۆی کردووە، وە من نازانم نەمدیوە ئەو ئەو الترمذي ـەی کە نکۆڵی فەرموودەی موجاهید دەکات لە هیچ فەرموودەیێک و غەیری فەرموودەش هەرگیز،

٢٢ - وَقَالَ أَبُو دَاوُدَ السِّجِسْتَانِيُّ: أَرَى أَنْ يُجَانَبَ كُلُّ مَنْ رَدَّ حَدِيثَ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ»، وَيُحَذَّرُ عَنْهُ، حَتَّى يُرَاجِعَ الْحَقَّ،

السنة لأبي بكر بن الخلال

وه ابو داود السجستاني ووتى وايدەبينم كه دەبێت خۆ بەدوور بگيردرێت له هەموو ئەوانەی فەرموودەی ليث له موجاهيدەوه دايدەنيشێنێت لەسەر عەڕش، ڕەت دەكەنەوه، وه تانەی لێبدرێت هەتاوەكو دەگەڕێتەوه سەر حەق

٢٣ - وَقَالَ هَارُونُ بْنُ الْعَبَّاسِ الْهَاشِمِيُّ: جَاءَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ هَذَا التِّرْمِذِيَّ الْجَهْمِيَّ الرَّادَّ لِفَضِيلَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَحْتَجُّ بِكَ، فَقَالَ: كَذَبَ عَلَيَّ، وَذَكَرَ الْأَحَادِيثَ فِي ذَلِكَ، فَقُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ: اكْتُبْهَا لِي، فَكَتَبَهَا بِخَطِّهِ، حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ فِي قَوْلِهِ ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ»، فَحَدَّثْتُ بِهِ أَبِي

السنة لأبي بكر بن الخلال

هارون بن العباس الهاشمي ووتى : عبداللّٰه بن أحمد هاته لامان، جا پێم ووت ئەو الترمذي ـە جەهميە ڕەتى فەزيلەتى پێغەمبەرى خوا ﷺ دەكاتەوه، تۆش وەک بەڵگە دێنێتەوه، عبداللّٰه ووتى درۆى لەسەر كردووم، وه باسى فەرموودەكەى كرد سەبارەت بەمە، جا بە عبداللّٰه بن أحمدم ووت بۆمى بنووسەوه جا بۆى نووسيمەوه بە خەتى خۆى، بۆى باسكردين هارون بن معروف ووتى بۆى باسكردين محمد بن فضيل له ليث ـەوه له موجاهيدەوه سەبارەت بەم قەوله ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتى دايدەنيشێنێت لەسەر عەڕش،

٢٤ - حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ، ثَنَا أَبُو الْهُذَيْلِ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُجْلِسُهُ مَعَهُ عَلَى الْعَرْشِ»، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ جَمَاعَةٍ، وَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنَ الْمُحَدِّثِينَ يُنْكِرُهُ، وَكَانَ عِنْدَنَا فِي وَقْتٍ مَا سَمِعْنَاهُ مِنَ الْمَشَايِخِ أَنَّ هَذَا الْحَدِيثَ إِنَّمَا تُنْكِرُهُ الْجَهْمِيَّةُ

## السنة لأبي بكر بن الخلال

له موجاهیدەوە سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی : دایدەنیشێنێت لەلای خۆی لەسەر عەڕش،
عبد اللّٰه ووتی : ئەم فەرموودەیەم بیستووە لە جەماعة وە نەمدیوە هیچ یەکێک لە موحەددیثین ئینکاری بکەن، سەردەمێک لە شێخەکانەوە بیستمان کە ئەم فەرموودەیە لە لایەن جەهمیەکانەوە نکۆڵی لێ کراوە،

٢٥ - قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ أَبِي زُهَيْرٍ يَقُولُ: قَالَ هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ: «هَذَا الْحَدِيثُ تَرُدُّهُ الزَّنَادِقَةُ»

## السنة لأبي بكر بن الخلال

هارون بن معروف ووتی ئەم فەرموودەیە لەلایەن زەندیقەکان ڕەت کراوەتەوە

٢٦ - وَحَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قالَ: سَمِعْتُ بَعْضَ أَصْحَابِنَا، قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى مُوسَى الرَفَا: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]، قَالَ: «نَعَمْ، يُقْعِدُ مُحَمَّدًا عَلَى الْعَرْشِ»

**السنة لأبي بكر بن الخلال**

بۆی باسکردین أبو بکر ووتی گوێم لە هەندێک هاوڕێکانم بوو ووتی : ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] بەسەر موسی الرفا دا خوێندەوە، جا موسی ووتی بەڵێ، محمدﷺ دادەنیشێنێت لەسەر عەڕش

٢٧ - وَحَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: ثَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ بِشْرِ بْنِ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ النَّخَعِيُّ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُقْبَةَ الشَّيْبَانِيُّ، وَأَحْمَدُ بْنُ الْفَرَجِ الطَّائِيُّ، قَالَا: ثَنَا عُبَادَةُ بْنُ أَبِي رَوْقٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنِ الضَّحَّاكِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ»

**السنة لأبي بكر بن الخلال**

لە ضحاك ـەوە لە إبن عباس ـەوە سەبارەت بەم قەولە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی : دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش

٢٨ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: جَاءَنِي كِتَابُ عَلِيِّ بْنِ سَهْلٍ بِخَطِّهِ، وَفِيهِ حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ، وَخَلَّادُ بْنُ أَسْلَمَ، قَالَا: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُجْلِسُهُ عَلَى الْعَرْشِ» . وَهَذِهِ فَضِيلَةٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَمَنْ رَدَّ فَضِيلَةَ النَّبِيِّ ﷺ فَهُوَ كَافِرٌ، وَلَقَدْ قَالَ سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى: قُلْتُ لِأَبِي: لَوْ رَأَيْتُ رَجُلًا يَسُبُّ أَبَا بَكْرٍ مَا كُنْتَ صَانِعًا بِهِ؟ قَالَ: أَقْتُلُهُ، قُلْتُ: فَعُمَرَ، قَالَ: أَقْتُلُهُ، فَهِيَ لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَكَيْفَ بِمَنْ رَدَّ فَضَائِلَ النَّبِيِّ ﷺ

السنة لأبي بكر بن الخلال

له موجاهیدەوە سەبارەت بەم قەولە﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش،
وە ئەوە فەزیلەت و پێگەیێکە بۆ پێغەمبەری خواﷺ جا هەر کەسێک فەزیلەت و پێگەی پێغەمبەری خواﷺ ڕەت بکاتەوە ئەوە کافرە، وە سعید بن عبدالرحمن بن أبزی ووتی ووتم بە باوکم گەر پیاوێک ببینی جنێو بە أبو بکر بدات چی لێدەکەی.؟ گوتی دەیکووژم، ووتی وە پێشیم ووت ئەی عومەر.؟ ووتی دەیکووژم، جا ئەوە بۆ أبو بکر و عمرە، جا ئەبێ چۆنبێت بۆ ئەو کەسەی ڕەددی فەزیلەتی پێغەمبەری خواﷺ ئەکاتەوە،

٢٩ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: ثَنَا عَبَّاسُ الْعَنْبَرِيُّ، قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ، قَالَ: ثَنَا سَلْمُ بْنُ جَعْفَرٍ، وَكَانَ، ثِقَةً عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ سَيْفٍ السَّدُوسِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى كُرْسِيِّ الرَّبِّ»، قِيلَ لِلْجُرَيْرِيِّ: إِذَا كَانَ عَلَى كُرْسِيِّ الرَّبِّ فَهُوَ مَعَهُ (٢٥٧)، قَالَ: نَعَمْ،

## السنة لأبي بكر بن الخلال

عبدالله بن سلام ووتى پێغەمبەری خوا ﷺ له ڕۆژی قیامەتدا لەسەر کورسی پەروەردگار دەبێت، وترا بە الجريري ئەگەر لەسەر کورسی پەروەردگار بێت ئەوا لەگەلیەتی، ووتی بەڵێ،

٣٠ - قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَذَكَرَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ مَسْعَدَةَ، قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ كَثِيرٍ، قَالَ: ثَنَا سَلْمُ بْنُ جَعْفَرٍ الْبَكْرَاوِيُّ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ سَيْفٍ السَّدُوسِيِّ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ، قَالَ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ يَنْزِلُ الْجَبَّارُ عَنْ عَرْشِهِ وَقَدَمَيْهِ عَلَى الْكُرْسِيِّ، وَيُؤْتَى بِنَبِيِّكُمْ ﷺ، فَيُقْعِدُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ عَلَى الْكُرْسِيِّ»

## السنة لأبي بكر بن الخلال

عبدالله بن سلام ووتی : کاتێک کە ڕۆژی قیامەت هات ئەوا الجبار لەسەر عەڕش دادەبەزێت و پێیەکانی لەسەر کورسی دەبن(چونکە کورسی جێی پێی الله يە) وە پێغەمبەرەکەتان ﷺ دەهێندرێت لەبەردەمی دادنیشێندرێت،

٣١ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: ثَنَا أَبُو الْفَضْلِ عَبَّاسُ بْنُ مُحَمَّدٍ الدُّورِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عُبَيْدٍ الْقَاسِمَ بْنَ سَلَّامٍ، يَقُولُ: هَذِهِ الْأَحَادِيثُ حَقٌّ لَا يُشَكُّ فِيهَا، نَقَلَهَا الثِّقَاتُ بَعْضُهُمْ عَنْ بَعْضٍ حَتَّى صَارَتْ إِلَيْنَا، نُصَدِّقُ بِهَا، وَنُؤْمِنُ بِهَا عَلَى مَا جَاءَتْ. قَالَ أَبُو الْفَضْلِ: وَنَحْنُ نَقُولُ فِي هَذِهِ الْأَحَادِيثِ مَا قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ مُتَّبِعِينَ لَهُ وَلِآثَارِهِ فِي ذَلِكَ

السنة لأبي بكر بن الخلال

أبو عبيد القاسم بن سلام دەیووت : ئەم فەرموودانە حەق و ڕاستن هیچ شکو گومانێکیان تێدا نییە، ڕاستگۆ و متمانەپێکراوەکان گێڕاویەتیانەوە هەندێکیان لە هەندێکیان تاوەکو گەییشتووە بە ئێمە، پێمان ڕاستە، بڕوامان پێی هەیە وەک چۆن هاتوون. وە أبی الفضل ووتی : ئێمە سەبارەت بەم فەرموودانە ئەوە دەڵێین کە أحمد بن حنبل دەیڵێت، وە شوێن کەوتەی ئەو و شوێنەواری ئەویش بۆ ئەمە

٣٢ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: ثَنَا الْفَضْلُ بْنُ سُلَيْمَانَ، قَالَ: ثَنَا الْهَيْثَمُ بْنُ خَارِجَةَ، قَالَ: ثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: سَأَلْتُ سُفْيَانَ، وَالْأَوْزَاعِيَّ، وَمَالِكَ بْنَ أَنَسٍ، وَاللَّيْثَ بْنَ سَعْدٍ، عَنْ هَذِهِ الْأَحَادِيثِ،؟ فَقَالُوا: «نمُرُّهَا كَمَا جَاءَتْ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

**الوليد بن مسلم ووتی پرسیارم کرد له سوفیان و ئەوزاعی و مالک و بن انس وه الليث بن سەعد سەبارەت بەم فەرموودانە.؟**
**جا ووتیان : تێیان دەپەڕێنین وەک چۆن هاتوون، واتا کاریان پێ دەکەین و بڕوامان پێیان هەیە و دەیان گێڕینەوە وەک چۆن وتراون**

**٣٣ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ بْنَ الْفَضْلِ عَنْ حَدِيثِ مُجَاهِدٍ: «يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ»، فَقَالَ: حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ مَعْرُوفٍ، وَعُثْمَانُ، عَنِ ابْنِ فُضَيْلٍ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ»، قَالَ: وَقَالَ: مَنْ رَدَّ هَذِهِ (٢٦٠) الْأَحَادِيثَ فَهُوَ مُبْتَدِعٌ ضَالٌّ. قَالَ: مَا أَدْرَكْنَا أَحَدًا يَرُدُّهُ إِلَّا مَنْ فِي قَلْبِهِ بَلِيَّةٌ، يُهْجَرْ وَلَا يُكَلَّمُ**

**السنة لأبي بكر بن الخلال**

**أبو بكر ووتی پرسیارم کرد له الحسن بن الفضل سەبارەت بە فەرموودەی موجاهید (يُقْعِدُهُ عَلَى الْعَرْشِ) جا ووتی بۆی باسکردین هارون بن معروف وه عثمان له ابن فضيل ـەوه له ليث ـەوه له موجاهیدەوە سەبارەت بەم قەوله ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی دایدەنیشێنێت لەسەر عەڕش، أبو بکر ووتی وه الحسن بن الفضل ووتی هەر کەسێک ئەم فەرموودانە ڕەتبکاتەوە ئەوا موبتەدیعێکی گومڕایە، ووتی نەگەییشتووین کەسمان نەدیوه ڕەتی بکاتەوە جگە لەوەی له دڵیدا فیتنە و هەڵخلیسکان و بەلای تیابێت، وه هەجری دەکرێت و قسەی لەگەڵ ناکرێت،**

٣٤ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ السُّلَمِيُّ، قَالَ: ثَنَا يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُكَيْرٍ، قَالَ: ثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ، قَالَ: حَدَّثَنِي بَكْرُ بْنُ سَوَادَةَ، عَنْ زِيَادِ بْنِ نُعَيْمٍ، عَنْ وَفَاءٍ الْحَضْرَمِيِّ، عَنْ رُوَيْفِعِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ، وَقَالَ: اللَّهُمَّ أَنْزِلْهُ الْمَقْعَدَ الْمُقَرَّبَ عِنْدَكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَجَبَتْ لَهُ شَفَاعَتِي»

السنة لأبي بكر بن الخلال

له پێغەمبەری خواوەﷺ کە فەرمووی : هەر کەسێک صلاوات بدات لەسەر محمد وە بڵێت ئەی خوایە لە شوێنێک دایبنیشێنە لەسەر کورسی لە نزیکی خۆت لە ڕۆژی قیامەت، ئەوا شەفاعەت کردنم بۆی واجب دەبێت،

٣٥ - حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: ثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ هِشَامٍ مُسْتَمْلِي ابْنِ عَرَفَةَ، قَالَ: ثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَرَفَةَ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ ثَابِتٍ الْجَزَرِيِّ، عَنْ غَالِبِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ الْعُقَيْلِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي الْمَكِّيُّونَ ذَكَرَ مِنْهُمْ عَطَاءً وَعَمْرَو بْنَ دِينَارٍ: أَنَّ اللَّهَ يَغْضَبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ مِثْلَهُ، فَيَقُومُ نَبِيُّنَا مُحَمَّدٌ ﷺ فَيُثْنِي عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، قَالَ: فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: ادْنُهُ، قَالَ: ثُمَّ يَغْضَبُ فَيَقُومُ نَبِيُّنَا، فَيُثْنِي عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ لَهُ أَهْلٌ، فَيَقُولُ لَهُ: ادْنُهُ، فَلَا يَزَالُ يَقُولُ لَهُ: ادْنُهُ، حَتَّى يُقْعِدَهُ عَلَى الْعَرْشِ، قَالَ: وَجِبْرِيلُ قَائِمٌ، فَيَقُولُ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ هَذَا يَعْنِي جِبْرِيلَ جَاءَنِي بِرِسَالَاتِكَ، فَيَقُولُ اللَّهُ : صَدَقَ»

السنة لأبي بكر بن الخلال

غالب بن عبيد اللّٰه العقيلي ووتى بۆيان باسكردين مەككەييەكان وە لەناو ئەو مەككەييانە ناوى عەطاء بن الرباح و عمرو بن دينارى هێناوە : كە اللّٰه تعالى توورە دەبێت لە ڕۆژى قيامەت، كە تورە نەبووە بەم شێوەيە، جا پێغەمبەرمان محمدﷺ هەلدەستێت و ستاييشى دەكات بەو شێوەى شاييستەى خۆيەتى، جا اللّٰه پێى دەڵێت نزيک بەوە، ووتى پاشان تورە دەبێت و پێغەمبەرمان هەلدەستێت و ستاييشى دەكات بەوەى شاييستەيە بەو، جا اللّٰه بە محمد ﷺ دەڵێت نزيک بەوە، بەردەوام پێى دەڵێت نزيک بەوە تاوەكو دادەنيشێت لەسەر عەڕش، ووتى وە جبريليش وەستاوە، جا پێغەمبەرﷺ دەڵيت ئەوە يانى جبريل دەهاتە لام و پەيامەكانتى بۆ دەهێنام، جا اللّٰه پێى دەڵێت ڕاستە،

٣٦ - حَدَّثَنَا أَبُو الْقَاسِمِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْبَغَوِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْكُوفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ يَعْنِي ابْنَ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَحَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: «الشَّفَاعَةُ» وَفِي حَدِيثِ أَبِي أُسَامَةَ: «هُوَ الْمَقَامُ الَّذِي يَشْفَعُ فِيهِ لِأُمَّتِهِ»

حَدَّثَنَا أَبُو الْقَاسِمِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْبَغَوِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْكُوفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا وَكِيعٌ قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدُ يَعْنِي ابْنَ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی : ئەوە بۆ شەفاعەتە،

قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: وَحَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ سەبارەت بە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] ووتی : ئەوە ئەو شوێنەیە کە شەفاعەتی لێ دەکەم بۆ ئوومەتەکەم

٣٧ - وَحَدَّثَنَا أَبُو مُحَمَّدٍ بْنُ صَاعِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ الْحَسَنِ الْمَرْوَزِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُبَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا دَاوُدَ الْأَوْدِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، فِي قَوْلِ اللَّهِ : ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هُوَ الْمَقَامُ الَّذِي أَشْفَعُ فِيهِ لِأُمَّتِي»

الشريعة للآجري

له أبو هريرة وه سەبارەت بەم قەولە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]

ووتی پێغەمبەری خوا ﷺ ووتی ئەوە ئەو شوێنەیە کە شەفاعەتی لێ ئەکەم بۆ ئوممەتەکەم

٣٨ - وَقَوله: ﴿عَسى أَن يَبْعَثك رَبك مقَاما مَحْمُودًا﴾ أجمع الْمُفَسِّرُونَ أَن هَذَا مقَام الشَّفَاعَة، وَقد ثَبت هَذَا عَن النَّبِي. وَفِي رِوَايَة أبي هُرَيْرَة أَن النَّبِي قَرَأَ قَوْله: ﴿عَسى أَن يَبْعَثك رَبك مقَاما مَحْمُودًا﴾ قَالَ: «هُوَ الْمقَام الَّذِي أشفع فِيهِ لأمتي»

## تفسير السمعاني

أبو المظفر السمعاني سەبارەت بەم قەوله ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩]
ووتی هەموو موفەسیران کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەوە شوێنی شەفاعەتە، وە ئەوە جێگیر کراوە لە پێغەمبەرەوەﷺ، وە لە ڕیوایەتی أبو هريرة دا پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا﴾ [الإسراء: ٧٩] جا،ووتی ئەمە ئەو شوێنەیە کە شەفاعەتی لێ ئەکەم بۆ ئوممەتەکەم،

---

الحمدللّٰه رب العالمين،
لێرە هاتینە کۆتایی کتێبەکە زۆرێک لە سەرچاوەی تریش هەبوون کە پڕبوون لەو باسانە، ئەمانەی کە هێناومن دوو سێ کتێبێکە، بەلام ئەمانە لەناو سەدان.کتێبی تردا هەبوون، لەبەر دووبارە بوونەوەیان نەمهێناون. جا داوام لە اللّٰه تعالى ئەوەیە نیەتم پاک بکاتەوە بۆ خۆی، وە بیکاتە توێشوو بۆ قیامەتم وە ئێوەس سوودی لێ ببینن، وەگەر اللّٰه تعالى بەهۆی تاوانەوە خستینیە دۆزەخەوە ئەوا داواکارم لە اللّٰه بمان خاتە بەر شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ

